## ناسنامەی کتێب

**ناوی پەرتووك** : تێگەیشتن لە نیقاب بە فەهمی سەلەف

**نوسین** : باوکی بوخاری

**ژمارەی پەڕە**: ٣٩

**ساڵ**: ١٤٤٤هـــ

# پێشەکی

إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ} (آل عمران:١٠٢)

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا} (النساء:١)

{يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا} (الأحزاب: ٧٠، ٧١)

أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صلى الله عليه وآله وسلم، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارِ.

( زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ ) ال عمران ١٤

واتا : بۆ خەڵکی ڕازێنراوەتەوەو جوانکراوەو لەلایان خۆشەویستکراوە ئەو شتانەی کە ئارەزووی تیایەو دڵ پێی خۆشە لە ئافرەتان.

لە **أبي سعيد الخدري** ـەوە لە رسول الله ـەوە ﷺ دەفەرمووێ : الله عزوجل دونیای بۆ ڕازاندۆتنەوە بە هەموو جوانیەکانیەوە ، وە تێی دا سەرپشکی کردوون ، وە بزانن چۆن کاری تێدا دەکەن ، تێی دا بترسن لەو دنیایە وە بترسن لە ئافرەتانتان ، چونکە یەکەم فیتنەی بەنی ئیسرائیل ئافرەتانیان بون . رواه مسلم

بۆیە خودی ئافرەتان فیتنە نین بەڵام جوانیەکانیان بۆ پیاوانی بێگانە بۆ تە فیتنە .

جا بەڵگانێ گەلە زۆر هەیە لەسەر ئەم باس و خواسە بەڵام هەوڵی ئەوەمان داوە کە زیاتر بە کورتی دەلیلەکان و تێگەیشتنێکی چاک دەرخەین ، وە ئەم نامیلکە زۆر گرنگە بۆ ئەو خوشکانەی کە نیقابن بۆ ئەوەی دڵنیا ببنەوە لە واجباتی ، بۆ ئەو خوشکانەشی کە دەیانهەوێ ببن بە نیقاب ستری خۆیان بکەن لە پیاوانی بێگانە ، ئەوەش باسێک و بابەتێکی گرنگە و پەیوەست بە قیاماتی هەموو تاکێکمانە چ بۆ پیاو کە بۆ خێزانی شی کاتەوە چ بۆ ئافرەتان بە گشتی ، وە ئەوەی باس دەکرێ سەبارەت بە وەی کە باسێکی خیلافیە ئەمە پاش سەردەمی سەلەفە چونکە لەسەر دەمی سەلەف و تا ئەو کاتەی پێش سەردەمی خەلەف ئەوا هیچ خیلافێک نەبووە لەوەی کە نیقاب دەبێ بکرێ وە ئەوان تەفسیری ئایەتی (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) یان دەکرد بەوەی کەوا مەبەست پێی ناو نوێژە دەستت و دەم وچاو عەورەتی ناو نوێژە و ئاساییە دیار بێ وە هەندێکیش لە مفسیران پێیان وایە ئەوانەی تەفسیریان بە دەست و دەم و چاو کردووە لەم ئایەتەی سەرەوە ئەوا هێشتا بە تەواوی حیجاب فەرز نەبوو بوو ، دەرەوەی نوێژ واتا بەڕوی نامەحرەم ، وە تەفسیری (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ)

یان دەکرد بەوەی کە نابێ هیچ جوانیەکی دەرخات بۆ کەسی بێگانە جا لە دەرەوە و ژوورەوە بێ (کە نامەحرەمی لێبێ )

ان شاءالله ئەمە ڕوون دەبێتەوە بە شێوەیەکی کورت و پوخت

وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ تَسْلِيمًا كثيرا دَائِما إِلَى يَوْم الدّين

باوکی بوخاری

١٠ ذل الحجه١٤٤٤

لە **عبد الله بن مسعود** ـەوە لە ڕێگای أبي الأحوص ـەوە دەفەمەرمووێ : عەوڕەت دوو جۆری هەیە : ئەو عەوڕەتەی لە زاهڕی دیارە، وە ئەو عەوڕەتەی یان جوانیەی کە لە ناوەوەیە کە ئەوەش کەس نایبێنێ جگە لە هاوسەرەکەی ، ئەو جوانیەی کە دیارە : جل و بەرگە ، ئەو جوانیەی کە لەناوەوەیە( نابێ دیار بێ) : کل ـی چاو ،بازن ،ئەڵقە (کە ئەمانە نابێ دیار بێ تەنها بۆ هاوسەری نەبێ ) لە لەفزی ابن جریر دەفەرمووێ : ئەوەی دیارە: جل و بەرگ ، ئەوەی کە دەشاردرێتەوە: خلخال، بازن و خەناوکە. أخرجه ابن أبي شيبة ٢٨٤/٤، وابن جرير ٢٥٦/١٧

ئیمام **احمد بن حنبل** رحمه الله دەفەرمووێ (ئەو زینەتەی کە دیارە : بریتیە لە جل و بەرگ ، وە هەموو شتێک لە ئافرەت عەوڕەتە هەتا نینۆکیشی ) الفروع لابن مفلح (٤٥٩/٢)

ئیمامی **شافعی** رحمه الله دەڵێ : لە بابی عەوڕەتی ئافرەت لە ناو نوێژ دا (کۆدەنگی هەموو موسڵمانان لەسەر ئەوەیە کە ڕێگری کراوە لە ئافرەت تبرج بکا ، سفور بێ ، نیقاب بکا ) ئەمە لەناو نوێژ نابێ چونکە عەوڕەتی ئافرەت لەناو نوێژ دەست و دەم و چاو ناگرێتەوە . نهاية المطلب(١٢/٣١)

**ابن قيم** دەڵێ:

( العورة عورتان: عورة في الصلاة، وعورة في النظر، فالحرة لها أن تصلي مكشوفة الوجه والكفين، وليس لها أن تخرج في الأسواق ومجامع الناس كذالك ) اعلام الموقعين ٢/٨٠

واتە : (عەورەت دوو جۆرە یەکەم عەورەتێک لەنوێژ ، دووەم عەورەتێک لەسەیرکردن ، ئەفرەت ئازادە لەنوێژ دەمووچا و هەردوو دەستی دەرخات بەڵام بەراستی بۆی نییە دەرچێت بۆ بازاڕ و شوێنە گشتییەکان بەم شێوەیە)

دەڵێم : ئەوە بزانە کە عەوڕەتی ناو نوێژ بریتیە لە هەموو جەستە جگە لە دەست و دەم و چاو ، واتا نابێ دەرخرێ لە زینەت و جوانی جگە لە دەست و دەم و چاو ، عەوڕەت و زینەتی دەرەوە ئەوەیە کە هەموو جەستەیە بە دەم و چاو و دەستەکان ـیشەوە .

## الله تعالی دەفەرموێ :

(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا) الاحزاب ٥٩

واتا : ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ بە هاوسەرانت و کچەکانت و بە ئافرەتانی بڕواداران بڵێ با عەباکانیان بدەن بەسەر خۆیاندا (خۆیان و جوانیان پێ داپۆشن) ئەوە نزیکترە بناسرێن بەداوێن پاکی تا بەهۆیەوە ئازار نەدرێن و الله لێخۆشبووی میهرەبانە .

لە **عبد الله بن عباس** لە ڕێگای علي ـەوە سەبارەت بە ئایەتی (يا أيُّها النبى قُلْ لِأَزْواجِكَ وبَناتِكَ ونِساءِ المُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلابِيبِهِنَّ) دەفەرمووێ : الله ئەمری بە ئافرەتان کرد کە چونە دەرەوە ، بۆ حاجەتێک ئاوا دەم چاویان داپۆشن لە سەر سەریانەوە تا خوارەوەی بە جلابیب وە وا بکەن یەک چاویان دەرخەن. أخرجه ابن جرير ١٨١/١٩.

لە **محمد بن سيرين** ـەوە دەڵێ پرسیارم لە عبيدة السلماني كرد سەبارەت بە ئایەتی (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلابِيبِهِنَّ) بەتانیەکی لەسەری خۆی دانا ، سەر و دەم و چاوی داپۆشت ، پاشان یەک چاوی دەرخست.

تفسير ابن أبي حاتم

**سعيد بن جبير** سەبارەت بە ئایەتی (مِن جَلابِيبِهِنَّ) دەفەرمووێ : قیناعێکە لەسەر خیمار (دەبێتە نیقاب ) ، وە بۆ ئافرەت حەڵاڵ نیە بێگانە ببینێ ئیلا ئەگەر قیناعێک لەسەر خیماری لەبەر نەبێ (واتای نیقاب دێ) ئایا جوانی لە ئافرەت لە کوێیە ئەگەر دەست و دەم و چاو نەبێ .

موسوعة التفسير المأثور

**عكرمة** مولای ابن عباس دەفەرمووێ (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلابِيبِهِنَّ) : پۆشاکێک کە گەردن و بن ملی دا بپۆشێ . موسوعة التفسير المأثور

**محمد بن سيرين** لە ڕێگای ابن عون ـەوە دەفەرمووێ (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلابِيبِهِنَّ) : تەنها چاو نەبێ (واتا ئەوانی تر دادەپۆشێ )

أخرجه الفراء في معاني القرآن ٣٤٩/٢

**يحيى بن سلّام** دەڵێ : (يا أيُّها النبي قُلْ لِأَزْواجِكَ وبَناتِكَ ونِساءِ المُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلابِيبِهِنَّ) ئاوا جلبابە : عەبایەکە دەم و چاوی پێ دادەپۆشێ وە چاوی ڕاست و لوتی پێ دادەپۆشێ . تفسير يحيى بن سلام ٧٣٨/٢

**مجاهد بن جبر** لە ڕێگای ابن أبي نجيح ـەوە دەفەرمووێ سەبارەت بە ئایەتی: (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلابِيبِهِنَّ) فەرمووی : خۆیان جوان پێ دادەپۆشن (لەسر سەری بۆ خواری خوارەوە) . أخرجه ابن جرير ١٨٢/١٩-١٨٣

❁ ئەوەی هەیە کەهەندێ دەڵێن چاوێکی بە تەنها کە چاوی چەپە دەبێ دەرخا هەندێکیتر لە سەلەف دەفەرموون هەردوو چاوی کێشە نیە بەڵام قەولی أصح ئەوەیە جلباب بکا واتا هەموو جەستە کە لە تۆقی سەری تا خوارەوەی بنی پێیی ابن عمر دەفەرمووێ بستێک کراسەکەی درێژ دەکاتەوە لە کەعبەکانیەوە .

**ابن رجب** سەبارەت بە (الجلباب) دەڵێ : جلێکە داپۆشەری هەموو جەسدە ، لەسەر پۆشاک دەپۆشرێ. (مەبەست پێ نیقابە) . فتح الباری لابن رجب (٥٠٧/١)

**ابن كثير** دەڵێ : (الجلباب) جلێکە لەسەر خیمار دەپۆشرێ (مەبەست پێ نیقابە) دەڵێ ئەوانەش وا دەڵێن لە (ابن مسعود ، عبيدة ، قتادة ، الحسن البصري ، سعيد بن جبير ، ابراهيم النخعي ، عطاء الخراساني زۆری تر )

❁ هەندێک لەهاوەڵان و شوێنکەوتوان الله لێیان ڕازیبێت تەفسیری (ادناء الجلباب) دەکەن بەداپۆشینی (دەم و چاو) کەلەئایەتەکەی سەرەوە بە (جلابيبهن) هاتووە

ئەمەش قەولی ئەم زانایانەیە :

( **ابن مسعود**، **ابن عباس**، **قتادة**،**حسن البصرى**،**سعيد بن جبير**، **ابراهيم النخعي**، **والعضاء الفراسانى**، **الحسن البصري** ، **مجاهد بن جبير** ، **عطاء الخراساني** ، **مقاتل بن سليمان** ، **محمد بن كعب** ، ...زۆری تر )

# دەرخستنی جوانی بۆ پیاوانی نامەحرەم پیشەی ئافرەتانی سەردەمی نەزانیو نەفامی بووە

(وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۖ )

الاحزاب ٣٣

[وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ]

وە لەماڵەکانی خۆتاندا جێگیرو نیشتەجێ بن و بۆ جگە لە پێویستی مەچنە دەرەوە، تەنانەت بۆ نوێژکردنی جومعەو جەماعەت و تەراویح باشتر وایەو خێری زیاترە ئافرەت لە ماڵی خۆی نوێژ بکات و دەرنەچێت.

[وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى]

وە وەکو ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی پێشوو جوانی خۆتان بۆ پیاوانی نامەحرەم دەرمەخەن، (کەواتە سفوری و خۆدانەپۆشین و

دەرخستنی جوانی پێشکەوتن نیە بەڵکو پیشەی ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی بووە لە پێش ئیسلامدا).

رسولُ اللهِ (ﷺ) دەفەرمووێ:

**((الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ , وَإِنَّهَا إِذَا خَرَجَتْ ؛ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ , وَإِنَّهَا لاَ تَكُونُ إِلَى وَجْهِ اللَّهِ : أَقْرَبَ مِنْهَا فِى قعرِ بيتِها))**

واتـە : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ئافرەت عەورەتە ، کاتێك لەماڵەوە دەرئەچێت ، شەیتان لەبەر چـاوی پیاوانی نامەحرەم دەیڕازێنێتەوە ، بەڕاستی چاکتـرین شــت بۆ ئافرەت بۆ ئەوەی ڕەزامەندی الله بەدەست بێنێت مانەوەیەتی لەناو ماڵەکەی

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:(**المرأة هي العورة**) واتــــە ئافــرەت عەورەتە ئەمەش واتـــە هەموو گیـــانی عەورەتە هەڵبەت روخساریشی.

**ثبت في الصحيحين عن عائشة(رضي الله عنها) قالت : كان رسول الله(ﷺ)يصلي الفجر فيشهد معه نساء من المؤمنــات متلفعات بمروطهن ثم يرجعن إلى بيوتهن ما يعرفهن أحدٌ من الغلس**

واتــە:لە **عائیشەوە** (رضي الله عنها) فەرموویەتی:

پێغەمبەر (ﷺ )نوێژی بەیانیــــانی دەکرد ئافرەتانی ئیمانداریشیان لەگەڵ بوو بەڵام زۆر بە پێچـــراوەیو مەستووری بە جـۆرێک کە دەگەڕانەوە ماڵەوە کەس نەیدەناسینەوە بە جــۆرێک خــــۆیان دەپێچــایەوە.

**عن عائشة (رضي الله عنها) قالت:**

**( كَانَ الرُّكْبَانُ يمُرُّونَ بِنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)مُحْرِمَاتٌ فَإِذَا جَاوَزُوا بِنَا سَدَلَتْ إِحْدَانَا جِلْبَابَهَا مِنْ رَأْسِهَا عَلَى وجهِها فإذا جاوزونا كشفناهُ )** رَوَاهُ أَبُو دَاوُد

واتا **عائیشە** (رضي الله عنها) فەرمویەتی:

لەکاتێک دا کە ئێمەی ئافرە تان لە گەڵ پێغەمبەری الله بووین (ﷺ)لە حالەتی ئیحرام دا ، جا کاتێک پیاوان بەلاماندا رەت بوونایە یەکێکمان

پێچەکەی لەسەر سەریەوە شۆر دەکردە وە سەر رووی ، پاشان کە تێدەپەرین لامان دە بردە وە.

**عن صفية قالت (رأيت عائشة طافت بالبيت وهي منتقبة).**

لە **سەفیەی کچی شیبە** ـەوە دەفەرمووێ : عائشەم بینی طەوافی دەکرد ئەو نیقابی کردبوو . طبقات الكبرى(٧١/٨)

لە ( **علي بن أبي طلحة** )ەوە هاتووە کە پێشەوا ئیبن عباس (الله لێی ڕازی بێ ) فەرموویەتی :**أمر الله نساء المؤمنين إذا خرجن من بيوتهن في حاجة أن يغطين وجوههن من فوق رؤوسهن بالجلابيب، و يبدين عيناً واحدة.**

واتە: (الله تعالی فەرمانی کردووە بە ئافرەتی ئیماندااران کاتێک دەردەچن لە ماڵ بۆ پێویستیەک دەبێت رووخساریان داپۆشن بە جیلبابەکانیان (ئەوەیە کە هەموو جەستە دادەپۆشێ) وە تەنها یەک چاویان دەربخەن.

**عن أسماء بنت أبي بكر -رضي الله عنهما قالت : كنا نغطي وجوهنا من الرجال وكنا نمشط قبل ذلك في الإحرام .** أخرجه الحاكم (١\٤٥٤)وقال حديث صحيح على شرط الشيخين.

واته :لە ئەسمای کچی ئەبوبکر-(ڕەزای الله لە هەردوکیان بێت) فەرموویەتی :

ئێمە دەم و چاومان دا ئەپۆشی لە بەرامبەر پیاوان، پێش ئێستا لە ئیحرام دەرمان دەخست ئەم فەرمایشتەی ئەسماء بەڵگەیەکی زۆر ڕوونە کە ئافرەتە ئیماندارەکانی ئەو کاتە نیقابیان پۆشیوە .

**عن فاطمة بنت المنذر أنها قالت: (كنا نخمر وجوهنا ونحن محرمات مع أسماء بنت أبي بكر الصديق)**

لە **فاطیمەی کچی منذر** فەرمووی : (ئێمە هەموومان دەم و چاومان داپۆشت بوو لە ئیحرام بووین لەگەڵ ئەسمائی کچی ابي بكر الصديق )

رواه مالك في ((الموطأ)) (٣/ ٤٧٤) (١١٧٦)

دەڵێم : ئەمانەش بەڵگەن بۆ ئەوانەی کە دەڵێن نیقاب و داپۆشینی هەموو جەستە تەنها تایبەت بووە بە خێزانەکانی پێغەمبەر سەلات و سەلامی اللەی لێبێ.

**أبو بكر الجصاص** دەڵێ :

ئافرەتی گەنج ئەمری پێ ئەکرێت ڕوخساری دابپۆشێت لە پێش پیاوی بێگانە ، وە خۆیی ستر بکات لە کاتی چونە دەرەوە ، چونکە ئەهلی نیفاق تەماحی تێ ئەکەن . أحكام القرآن ـ موجەلەدی ٣ لاپەڕەی ٤٥٨.

**السرخسي** ـ ئەڵێ:

[نەزەر بۆچی حەڕام کراوە لە ترسی فیتەنە ، وە ترسی فیتنەش لە دەم و چاو و ڕوخسار دایە ، وە جوانترین سەرنج ڕاکیشترین ئەندامی ئافرەت دەم و چاو ڕوخسارە لە چاو تەواوی ئەندامەکانی تر] . المبسوط ـ موجەلەدی ١٠ لاپەڕەی ١٥٢

وە هەر یەک لە [ **الإسبيجانيُّ** و**المرغينانيُّ** و**الموصليُّ** ] ئەڵێن:

(ڕووخساری ئافرەت لەناو نوێژ عەورەت نیە ، بەڵام لە خاریجی نوێژ عەورەتە ، وە قەولی ڕاجح و پەسند ئەهێنن لە (شرح المنية ) کە بە تەئکید ڕوخساری ئافرەت عەورەتە بە موطلەقی.

وە ئەڵێت : بەڵام لە کاتی هەبوونی پیاوی بێگانە واجبە داپۆشینی ڕووخسار و حەڕامە دەرخستنی لەناو نوێژدا) حاشية إعلاء السنن للتهانوي لاپەڕەی ١٤١

ئیمامی **أحمد** ـ رحمه الله دەڵێ:

نینۆکی ئافرەت عەوڕەتە، ئەگەر لە ماڵ دەرچوو ،نابێ هیچ شتێکی دەرخات. الفروع ـ موجەلەدی ١ لاپەڕەی ٦٠١.

**إسحاق الكوسج** دەڵێ پرسیارم لە ئیمام احمد کرد : ئایا ئافرەت طەواف دەکات بە نیقابەوە ؟

دەڵێ ئیمام گوتی : ئەگەر کەسی بێگانەیان لەگەڵ نەبوو هیچی تێدانیە.

وە هەمان پرسیاری لە اسحاق بن راهویە کرد فەرمووی : هەروەک احمد وتی . مسائل الكوسج (١٥٤٦)

وقال **ابن قدامة** دەڵێ : کێشە لەوە دا نیە ئافرەت طەواف بکا بە نیقابەوە ئەگەر کەسی بێگانە لەناویان هەبوو ، دایکە عائیشە طەوافی کردووە بەنیقابەوە وە عطاء کڕاهەتی لەوە دەکرد بەڵام لێی پەشیمان بووەوە.

المغني(٥/ ١٥٥)

**ابن القیم** دەڵێ:

شارع شەرعی داڕشتووە کە ئەبێت ئافرەتانی ئازاد ڕوخساریان داپۆشن لە پیاوی بێگانە و نامەحرەم ، بەڵام ئەو ئافرەتانەی پیر و پەککەوتەن واجب نیە لەسەریان.

قال الخلال:

وأخبرني منصور بن الوليد أن جعفر بن محمد حدثهم، قال: سمعت أبا عبدالله يقول: كل شيء من المرأة عورة، حتى ظفرها.

**خلال** دەلێت:- مەنصوری کوڕی ولید پێی وتم هەواڵی داپێم کە جعفری کوڕی محمد بۆی باسەکردم وتی گوێم لە باوکی عبدالله بوو (ئیمام ئەحمەد) دەیوت هەموو شتێکی ئافرەت واتە(ئەندامەکانی عەورەتە هەتا نینۆکیشی. الجامع لعلوم الإمام أحمد

**ابن تیمیّة** دەڵێ:

پێش دابەزینی ئایەتی حیبجاب ، ئافرەتان دەرئەچون لە ماڵ بەبێ جلباب ، پیاوان ڕوخسار و دەستی ئافرەتانیان ئەبینی ، ئەو کاتە جائیز بوو سەیری ڕوخسار و دەستی ئافرەت بکرێت ، پاشان الله عزوجل ئایەتی حیجابی دابەزاند الله عزوجل فەرمووی (يَـأَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنّ مِن جَلاَبِيبِهِنّ ) ئافرەتان پاش ئەم ئایەتە نە ئەبینران لەلایەن پیاوانەوە ، واتە هیچ شوێنێکی جەستەیان نەئەبینرا.

هەروەها ئەڵێ :

دەرخستنی ڕوخساری ئافرەت و سەیرکردنی پیاوی بێگانە جائیز نیە ، وە لەسەر وەلی ئەمری ئافرەتەکە پێویستە ئەمری پێ بکات بەچاکە و نەهی لێ بکات لەو مونەکەرە جگە لەوەش ، ئەگەر بە قسەی نەکرد سزا ئەدرێت و تەمبێ ئەکرێت.

خەڵکانێک هەن دەڵێن:

ئەی ئەوە نیە ابن عەباس تەفسیری (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) بە دەم و چاو و دەستەکان دەکات واتا کە دیار بن ئاساییە لێرە دەڵێین ڕاستە وای وتوە بەڵام جمهور دەڵێن : ( فهو محمول على حالة النساء قبل نزول آية الحجاب ، و أما بعد ذلك فقد أوجب الله عليهن ستر الجميع )

واتە : ئەو تەفسیرەی ابن عباس کاتێک بووە کە ئایەتی حیجاب هێشتا دانەبەزی بوو بەڵام دوای دابەزینی هەموو ئایەتەکانی حیجاب خوای گەورە ئەمری کرد بە داپۆشینی هەموو لاشە و روخساریش.

فەمودەیەکی صەحیحی پێغەمبەریش هاتوە فەرمویەتی:

**وعن ابن عمر أن النبي صلى الله عليه وسلم قال لا تنتقب المرأة المحرمة ولا تلبس القفازين.** رواه البخاري وغيره.

واتە:ئافرەت نابێ نیقاب یان دەست کێش بکاتە دەستی لەکاتی ئیحرام بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج یان عومرە ، بەو مانایە واتە لەکاتەکانی تر دەبێ بیکا بەڵام ئیحرام نابێ.

## ئایەتی فەڕزبوونی حیجاب (نیقاب ، دەست کێش)

﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَاۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ﴾ النور ٣١

أنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا كَانَتْ تَقُولُ لَمَّا نَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾ (النور: ٣١)

أَخَذْنَ أُزْرَهُنَّ فَشَقَّقْنَهَا مِن قِبَلِ الحَوَاشِي فَاخْتَمَرْنَ بها.

لە دایکە **عائشەوە** دەفەرمووێ : ئەوکاتەی ئەو ئایەتە دابەزی [وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ]

جا لەدامێنی کراسەکانمان پارچەمان لێ دەکردەوە وە ڕوخسارمان پێ دادەپۆشی

لە **سعيد بن جبير** لە ڕێگای عطاءـەوە دەفەرمووێ (وليضربن) بەتووندی (بخمرهن على جيوبهن) واتا : بەسەر سینگ و گەردنیان دادەدەن ، هیچ شتێک لەوانە نابێ ببینرێ . أخرجه ابن أبي حاتم ٢٥٧٥/٨-٢٥٧٦

# سەبارەت بە چاو داگرتنی ئافرەت بەرامبەر پیاو

**عبد الله بن عباس** لە ڕێگای علي بن أبي طلحة دەفەرمووێ (وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ) : ئافرەتانیش چاویان دادەخەن بەرامبەر شتێک کە شەهوەتی تیا بێ کە الله حەڕامی کردووە . أخرجه ابن أبي حاتم ٢٥٧٢/٨

**قتادة بن دعامة** لە ڕێگای سعيد دا دەڵێ (وقل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن): ئەوەیە کە نابێ و حەڵاڵ نیە سەیری ڕەگەزی بەرامبەریان کەن . أخرجه يحيى بن سلاّم ٤٤٠/١

**سليمان بن مهران الأعمش** لە ڕێگای عمّار بن محمد دەفەرمووێ (وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ) مەبەست پێ ئەوەیە داگرتنی چاویان بەرامبەر غەیری پیاوی خۆیان ( واتا نابێ جگە لە پیاوی خۆیان سەیری پیاوی تر کەن ) موسوعة الإمام ابن أبي الدنيا ١٢٢/٨ (٥٤٣)

**سفيان الثوري** لە ڕێگای عبد الله بن المبارك ـەوە (وقل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن) دەفەرمووێ : بۆ ئەوانیش حەڵاڵ نیە سەیری پیاوان کەن(بۆ ئافرەتان ) أخرجه ابن أبي حاتم ٢٥٧٢/٨

## سەبارەت بە ئایەتی

## (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا)

لە **عبد الله بن مسعود** لە ڕێگای أبي الأحْوَص کە دەفەرمووێ (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ) زینەت و جوانی کە نابێ دەرخرێ وەک :بازن ، زێڕ ، خلخاڵ ، گوارە ، خەناوکە (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) فەرمووی: جل و بەرگ ، وە ئەو پۆشاکەی کە هەموو جەستە دا دەپۆشێ. أخرجه ابن جرير ٢٥٦/١٧-٢٥٧، وابن أبي حاتم ٢٥٧٣، ٢٥٧٤، والطبراني (٩١١٥، ٩١١٧)

لە **عبد الله بن عباس** لە ڕێگای علي ـەوە دەفەرمووێ (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) ئەو ئەو جوانیەیە : دەم و چاو ، کل ـی چاو، دەست و مەچەک، ئەنگوستیلە ، ئەوا ئەوانەن کە دەری دەخا بۆ ئەو کەسانەی لەماڵەکەی دا دەژین أخرجه ابن جرير ٢٥٩/١٧.

**مقاتل بن سليمان** دەڵێت (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ) واتا : عەبا و پەچەکانیان دانانێن (إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ) واتا :بۆ هاوسەرانیان و (أَوْ آبَائِهِنَّ

أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ) ئەوانەی دەبنە مەحرەم. تفسير البغوي ٣٤/٦

(أَوْ نِسَايِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ)

لە **مجاهد بن جبر** لە ڕێگای لیث ـەوە (أَوْ نِسَائِهِنَّ) دەفەرمووێ : ئافەرەتی موسڵمان نابێ بۆ ئافرەتی موشریکان و یهودی و نصراني جوانیاین دەرخەن . أخرجه ابن أبي حاتم ٢٥٧٧/٨

**ابن كثير** : دەڵێ بۆ ئەوەیە نابێ ئافرەتانی موسڵمانان جوانیان دەرخەن بۆ ئافرەتی مشریکەکان . (جوانیەکان وەک خلخال و قژی و خەناوکە و بازن و ... هتد)

**وطاووس بن كيسان** لە ڕێگای لیث دەفەرمووێ : ئەو بەندەیە سەیری قژی ناکات . أخرجه عبد الرزاق (١٢٨٢٧)

لە **جابر بن عبد الله** ـەوە لە ڕێگای أبي الزبير دەفەرمووێ : ئافرەت نیقابی داناکەنێ بۆ بەندەی مێردەکەی . أخرجه يحيى بن سلّام ٤٤٣/١

لە **إبراهيم (النخعي)** لە ڕێگای عبيدة دەفەرمووێ: ئافرەت بە تەواوی خۆی دادەپۆشێ (بە دەم و چاویەوە) بۆ غولامەکەی . أخرجه ابن أبي شيبة ٣٣٥/٤

لە **عامر الشعبي** ـەوە لە ڕێگای المغيرة ـەوە دەفەرمووێ : ئافرەت لەلای بەندەکەی خیاڕ داناکەنێ ، بەڵام گەر سەرسامی نەکرد کێشەی نیە . علَّقه يحيى بن سلاّم ٤٤٣/١

لە **ابن أبي رباحـەوە** لە ڕێگای ابن جُريج ـەوە پرسیاری لێ کرا : ئایا بەندە سەر و قاچی خاوەنەکەی لە ئافرەت دەبینێ؟ دەڵێت : ئەو شتەم پێ خۆش نیە ، ئیلا گەر بەندەیەکی بچوک بێ ، بەڵام گەر پیاوێکی بە ڕیش بێ هەرگیز . أخرجه عبد الرزاق (١٢٨٢٥).

لە **عبد الله بن عباس** ـەوە لە ڕێگای عطية العوفي دەفەرمووێ : (أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ)وتی : ئەوا پیاوێکە کە عەقڵی لە شوێن خۆی نیە ، نە ئافرەت پێی سەرسامن نە ئەویش شەهوەتی ئەوەی هەیە. أخرجه ابن جرير ٢٦٧/١٧، وابن أبي حاتم ٢٥٧٨/٨،

لە **بسر بن سعيد** لە ڕێگای أبي النضر سالم ـەوە سەبارەت بەم ئایەتە (أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ) دەڵێت : پیرێکی بەتەمەن کە شەهوەتی بۆ ئافرەت نیە. أخرجه ابن أبي حاتم ٢٥٧٧/٨

لە **سعيد بن جبير** دەفەرمووێ (غَيْرِ أُولِى الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ) : پیاوێکی پیری بەتەمەن کە بۆ ئافەرەت شەهوەتی نیە . عزاه السيوطي إلى ابن أبي حاتم

لە **مجاهد بن جبر** ـەوە لە ڕێکای ابن أبي نجيح ـەوە دەفەرمووێ (أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ) : ئەو کوڕانەن کە نازانن ئافرەتی چیە و باڵغ نەبوونە. أخرجه ابن جرير ٢٧١/١٧، وابن أبي حاتم ٢٥٧٩/٨

**قتادة بن دعامة** دەڵێت : ئەوانەن نەگەیشتون بە بلوغ . أخرجه يحيى بن سلّام ٤٤٣/١

(وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ ) ألأَحزاب ٥٣

لەتەفسیری ئەم ئایەتە:

**ابن جريرى طبري** دەفەرمووێ : لە دوایی شتێک کە ببێتە بەربەست لەبینی ئێوە و ئەوان ، وە مەچوونە ژوورەوە سەربەخۆ . تفسير الطبري

(ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ)

الله دەفەرمووێ ئەگەر پرسیارتان لێیان کرد یان قسەتان لەگەڵ کردن لە دووای حیجابێک بێ ئەمە بۆ پاکیەتی دڵتان باشە بۆ ئەوەی چاوتان نەیان بینێ وە هەم بۆ دڵی ئەوانیش.

(وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ ۖ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) [النور ٦٠]

ئەو ئافرەتە پیرو پەککەوتانەی کە بە تەمای شوو کردن نین، قەیناکات ئەگەر هەندێك لە پۆشاکیان دابنێن، لە کاتێکدا جوانی خۆیان دەرنەخەن، خۆ ئەگەر پۆشتە بن ئەوە چاکترە بۆیان، خوایش بیسەرو زانایە (بە نیەت و خەتەرەو خەیاڵی دڵەکان).

لە **عبد الله بن عمر** ـەوە لە نافع ـەوە دەفەرمووێ : دانانی جیلباب، خیمار

واتا کەمێک لە جلەکانی بۆ دەرەوە وەک (گۆرەوی ، نیقاب و دەستەوانە) بۆ ئەو ئافرەتانەی بەساڵاچوون.

لە **سعيد بن جبير** ـەوە لە ڕێگای عطاء بن دینار ـەوە دەفەرمووێ:

(فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ): ئەو جلەی لەسەرەوەی

عەبایە ( مەبەست نیقابە )، کێشەی تێدانیە بۆ کەسی غەریب دەریان خا لە (دەم و چاو و دەست). أخرجه البخاري ١١٩/٦ (٤٧٩٣)، وابن جرير ١٦٢/١٩.

(جابر بن زيد و سليمان بن يسار و إبراهيم النخعي و مجاهد بن جبر و لابن أبي نجيح و ابن مسعود و ابن عمر و عبدالله بن عباس سعيد بن جبير ...) هەمان شت دەڵێن .

لە **مقاتل بن حيان** ـەوە لە ڕێگای بکیر ـەوە دەڵێ : دانانێ پەچەکەی ، نەوەک عەباکەی). علقه يحيى بن سلام ٧٣٣/٢

دەڵێم : کۆدەنگی هەموو سەلەفی لەسەرە کە ئافرەتی گەنج نابێ دەست و دەم و چاو دەرخات ئیلا کاتی زەڕوڕەت ، وە ئافرەتی پیر و بەساڵاچوو یان ئەوانەی مەوعیدی شوکردنیان نەماوە ئاساییە کەمێک لە جلابیب داکەن کە ئەویش بریتیە لە نیقاب و دەست کێش و گۆرەوی ، بەڵام گەر بیکەن ئەوا (وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ ) بۆ ئەوان باشترە و چاکترە. والله تعالى اعلم و احكم

# کۆتا بەڵگەمان بەسەرهاتی ئیفک ـە-

لە دایکمان **عائیشەوە** دەفەرمووێ ( ..... سەفوانی کوڕی معطل لە دوواوەی جەیش بوو گەیشتە ئەو شوێنەی منی لێ بە جێمابووم کە لە کاروانەکە دابڕابووم ئەوهات و منی بینی (کە لەو کاتە دایکە عائیشە خەوی لێکەوتبوو لە کاروانەکە دابڕابوو بەهۆی بزربونی خەناوکەیەکی کاروانەکەش ئەویان بەجێهێشت لەبەر ئەوەی هەر وایان زانی لەناو ئەو کەرنەقاڵەیە کە لەسەر حوشترەکە بووە بۆ ئافرەتان بۆیە ئەو دابڕاوە و قەدەری الله خەو دایکە عائیشە دەبا ، لەم کاتەدا بە دانیشتن سەری لار دەکاتەوە بە دارێک نیقابەکە شۆڕ دەبێتەوە بەلایەکی دا دەم و چاوی دیار دەبێ وە سەفوان دێت و دەیبینێ و دەیناسێتەوە ) وە هەستام و لە خەوەکەم منی ناسیەوە چونکە پێش فەڕزبوونی حیجاب منی بینی بوو وە من خیمارەکەم دادایەوە سەرم و جیلبابم کرد (کە هەستایەوە سەری ڕاست بویەوە و نیقابەکەش هاتەوە شوێن خۆی ) .... تا ئاخیری چونکە مەوزوعێکی درێژە بۆیە لە ژێرەوە ناونیشانی حەدیثەکە دادەنێم بەجوانی بیخوێننەوە...

جا دایکە عائیشە دەفەرمووێ (**وكان رآني قبل الحيجاب**) ئەمە دەلیلێکی زۆر بە قوەتەلەسەر ئەوەی کە پاش فەڕزبوونی حیجاب ئافرەتان نەدەناسرانەوە . وە بۆ ئافرەت حەڵاڵ نیە دەم و چاوی دەرخات پاش فەڕزبونی حیجاب ئەوەشی حەدیثێکی نیشان دای کە سەحابە ئافرەتی دیتیە و قسەیان کردیە یان مەوزوعێک لەم شتانە کە دەم و چاوی بینیبێ . هەموو ئەوانە پێش فەڕزبوونی حیجاب بووە . کە ئەو حیجابە بووە دەست و دەم و چاویشی گرتۆتەوە نەوەک وەک ئەو بەناو حیجابانەی ئێستا. البخاري(٤١٤١) و مسلم (٢٧٧٠)

ئەمانە هەمووی تەنها بەڵگانێکن بۆ ئەوەی بەرچاو ڕونیەک هەبێ لەلای گەنجانی اهلی سوننە کە نیقاب واجبێکی ئەم دینەیە و دەبێ ئافرەتانمان بیکەن تەواو بە حیجابێک دەست و دەم و چاو و دەستیان دابپۆشن ، وە هەندێ لە خەڵکی دەڵێن سونەتە بەڵام نەخێر واجبە و چونکە ئەگەر دایکمان عائیشە و ئەسماء و صەفیە و فاطمة و حەفصە و زۆرانێکی تر ... اللەلێان ڕازی بێ خۆیان داپۆشیبێ و خیماڕیان کردبێ لەبارامبەر باشترین جیل کە جیلی سەردەمی پێغەمبەرە سەلات و سەلامی

اللەی لێبێ ، ئاوا کچان و ئافرەتانی ئێستا هەزار و هەزار جاری تر لەم سەردەمە پێویسترە بەرامبەر گەنجان و پیاوانی ئەم سەردەمە بپۆشرێ کە سەردەمی فیتنە و فەساد و ئارەزووەکانە. . .

الله نیەتمان پاکاتەوە بۆ خۆی تەنها لە پێناو ڕەزامەندی ئەو ئەو کارەمان کردبێ ان شاءالله

هەر هەڵەیەک هەبێ لە خۆمەوەیە ئەوەی صوابە و جێگیرە و ڕاستە لە اللەـوەیە عزوجل

وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ تَسْلِيمًا كثيرا دَائِما إِلَى يَوْمِ الدّين